ناوی کتێب: بەرنامەی ژیان

ئامادەکردنردنی: احمد بلباس

دیزاین : مەریوان گرفیك (کارزان سەعدی)

تیراژ: ٥٠٠ دانه

چاپ: چاپخانەی شەهاب — هەولێر



لەبەرێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە سپاردنی ( ٧٢١)ی ساڵی ٢٠١٣ وەرگرتووە

**بەناوی خوای گەورەو دلۆڤان**

## پێشەکی

درودو سلاوی نەبراوە بۆ گیانی پاك و بێ گـەردی پێـشەوای مرۆڤایـەتی، (پێغەمبەرﷺ)ی نازدار محەمەد رسول اللە ، هەروەها بۆگیانی یـارو یـاوەران و شوێن کەوتوانی.

مەبەست لەکۆکردنەوەو ئامـادەکردنی ئـەم نامیلکەیـە ، ئاسـانکاریە بـۆ مێردمنالە چاو گەش و رۆلە موسلمانەکانی ئەم جیهانە. هەروەها لەبەر ئەوەی لەپشووی هاوینەی خویند کاران مە نهەجێکە یان نامیلکەیەکی کۆکراوە لەبـەر دەست نەبوو بەپێویستم زانی ئەم نامیلکەیە ئامادە بکـەم. هیـوادارم بـەبوونی هەر هەلەیەك لێم ببورن. لەکۆتای دا تەنیا، لەدووعای خێربێ بـەشمان نەکـەن و هیوادارم ببێتە مایەڕ خێر و بەرەکەت بۆ خوێنەران.



# پێغەمبەر محمد (ﷺ) بناسە

١- نـاوی (محمـد)ە (ﷺ) نـاوی بـ کی (عبـدالله) یـە وە نـاوی بـاپیری (عبدالمطلب)ە لـە نەتـەوەی عەرەبەلـە هـۆزی قورەیـشییە، ناسـراوە بـە (ابـو القاسم).

٢- ناوی دایکی (ئامینـە)ی کـچی (وەهـەب)ە کـە بەرێـزترین ئـافرەتی قورەیش بوو.

٣- لە سکی دایکی دابوو کە باوکی وەفاتی کرد.

٤- لە رۆژی دووشەممە لە (١٢)ی مانگی (رەبیع الاول) لە سـالّی (٥٧١) ی زایینی دا لە سالّی فیل لە شاری مەککە لە مالّی ابو طالب لە دایك بووە.

٥- ئەو ئافرەتانەی شیریان داوەتە پێغەمبەر (ﷺ) چوارن:

أ- ئامینەی دایکی.

ب-( بەرەکە)ی حەبەشی (ئوم ئەیمەن).

ت-( ثوەیبە).

ث-حەلیمە السعدیە.



٦- تەمەنی (٦) شەش سالّ بـوو دایکـی وەفـاتی کـرد دواتـر چـووە لای باپیری (عبدالمطلب).

٧- تەمەنی (٨) هەشت سالّ بوو بـاپیری وەفـاتی کـرد دواتـر چـووە لای مامی (ابو طالب)

٨- لە تەمەنی (١٢) دوانزە سالّی لەگەلّ مامی (ابو طالب) چووە بۆ شـام بەلاّم لە ڕێگادا گەرایەوە، لەبەرئەوەی (بوحەیرا)ی راهیـب ئامۆژگـاری مـامی

کرد که نەیبات بۆ ئەم سەفەرە، ووتی ئەگەر جولەکەکان بیبینن دەیناسنەوە و دەیکوژن ووتی ئەم کورە پلە و پایەیەکی بەرزی دەبێت.

٩- لە تەمەنی (٢٥) بیست و پێنج ساڵی ژنی هێنا، ناوی خێزانەکەی (خەدیجە) بوو(رضي الله عنها).

١٠- سێ کوڕی هەبوو:

أ- قاسم.

ب-عبدالله نازناوی (طاهر طیب) بوو.

ت-ابراهیم.

هەر سێ کیان بە منداڵی لەسەر دەمی پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دواییان کرد.



١١- چوار کچی هەبوو:

أ- زەینەب.

ب- ڕوقیە.

ت- ئوم کەلثوم.

ث-فاطیمە.

١٢- دوانزە مامی هەبوو, تەنها( ئیمامێ حەمزە و ئیمامی عەباس) موسوڵمان بوون.

١٣- شەش پلك (پور)ی هەبوو, تەنها (صَفیە) موسوڵمان بوو.

١٤- پێغەمبەر (ﷺ) بە (صادق الامین) راستگۆی دەست پاك بە ناوبانگ بوو.

١٥- لەتەمەنی (٤٠) چل ساڵی، لە شاری مەککە لە ئەشکەوتی (حیراء)، لە (١٧) ی رەمەزان لە رۆژی دووشەممە وەحی بۆ هات و بوو بە پێغەمبەر.

١٦- پێغەمبەر (ﷺ)سێ ساڵ بانگەوازی ئیسلامی بە نهێنی کرد دواتر بانگەوازەکەی بە فەرمانی خودا ئاشکرا کرد.

١٧- ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتی ناونرا بە ساڵی ماتەمین,بەهۆی کۆچی دوایی (ابو طالب و خدیجە)هەر لەو ساڵەش چوو بۆ (طائیف) بۆ بڵاو کردنەوەی ئایینی ئیسلام.

١٨- (١) ساڵ و (٣) مانگ پێش کۆچکردنی بۆ شاری مەدینە لە(٢٧)ی مانگی (ڕەجەب) لە بەشێکی شەو لە شاری مەککەوە چووە مزگەوتی (ئەقصا)دوواتر بەرز بۆوە بۆ ئاسمانەکان کە پێی دەووترێت(ئیسراو میعراج),هەر لەو شەوەش لە ئاسمان نوێژ فەرز کرا.



١٩- (١٣)ساڵ لە شاری مەککە مایەوە دواتر کۆچی کرد بۆ مەدینە.

٢٠- (١)ی مانگی (موحەڕەم)سەرەتای ساڵی کۆچییە.

٢١- لە ساڵی (٢)ی کۆچی لە(١٧)ی مانگی ڕەمەزان لە ڕۆژی هەینی جەنگی (بەدر)ڕویدا ,موسوڵمانەکان(٣١٣)کەس بوون,وە کافرەکانیش(١٠٠٠)کەس بوون.

٢٢- لە ساڵی(٣)ی کۆچی لە (١٥)ی مانگی (شەوال)لە ڕۆژی شەممە غەزای(ئوحود)ڕویدا, موسوڵمانەکان(٧٠٠)کەس بوون وە کافرەکانیش (٣٠٠٠) هەزار کەس بوون.

٢٣- له سالّی (٥) ی کۆچـی لـه مـانگی (شـەوال) جـەنگی (ئـەحزاب) ڕویدا,کافرەکان (١٠,٠٠٠)هەزار کەس بوون کە دواتر هێرشیان هێنا بـۆ سـەر شاری (مەدینە).

٢٤- له سالّی (٦)ی کۆچی ڕێککەوتننامەیان لەگەلّ (قورەیشیەکان)کرد, بەناوی ڕێککەوتننامەی (حودەیبییە).

٢٥- له سالّی (٨)ی کۆچی له (٢٠)ی مانگی ڕەمەزان له ڕۆژی هـەینی فەتحی شاری (مەککە)ی کرد.

٢٦- پێغەمبەر(ﷺ)بەخۆی له (٢٧)جەنگ بەشداری کردووە.

٢٧- یەکێك له کارە گرینگەکانی پێغەمبەر ڕزگـار کردنـی مرۆڤایـیـەتی بوو له بێ بڕوایی و کۆیلایەتی بەرەو بڕوا هێنان بە تاك و تەنیایی خودا.

٢٨- هەندێك له ڕەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ڕاسـتگۆیی, دەسـت پاکی, ڕووخۆشی, ئازایەتی, بەوەفایی, دان بەخۆداگر, لێبوردە, بەبەلّێن.

٢٩- ماوەی پێغەمبەرایەتی(٢٣)سالّ بوو یەکجاریش فەریزەی حەجی بـە جێ هێنا.

٣٠- له سالّی (١١)ی کۆچـی لـه(١٢)ی مـانگی (ڕەبیعـی یەکـەم) لـه ڕۆژی(دووشەممە)له تەمەنی (٦٣) سالّیدا لەشاری مەدینە وەفاتی کرد و هەر له مەدینە نێژرا.



هەزاران سلاّو له سەر گیانی پاکی پێغەمبەر(ﷺ).

## خەلیفە ئەبوبەکری صدیق

ئەبو بەکری صدیق: یەکەمین کەس بوو لە پیاوان کە موسوڵمان بوو،وە لە هاوەڵانی دڵسۆز و نزیکی پێغەمبەر(ﷺ)بوو.هەموو سەروەت و سامانی خۆی لە پێناو سەرخستنی بانگەوازەکەی پێغەمبەر(ﷺ)خەرج کرد.

لە دوای پێغەمبەر(ﷺ)ئەبوبەکری صدیق(رضي الله عنه) بە یەکەم خەلیفەی موسوڵمانان دادەنرێت.بەڕێزیان لە ساڵی (١٣)ی کۆچی وەفاتی کرد.تەمەنی هەروەك تەمەنی پێغەمبەر(ﷺ)(٦٣)ساڵ بوو،گۆڕەکەی لە تەنیشت گۆڕی پێغەمبەری نازدار(ﷺ) نێژرا.



## خەلیفە عومەری کوڕی خەطاب

عومەری کوڕی خەطاب:لە ساڵی(٥یان٦)ی پێغەمبەرایەتی دا لە مەککە موسوڵمان بوو.موسوڵمان بوونەکەی بۆ موسوڵمانان خێر و بەرەکەت بوو. خەلیفە عومەر (رضي الله عنه) هەموو کات هۆگری پێغەمبەر بووە وە هەموو کات لە خزمەتی دابووە، لە دوای کۆچی دوایی خەلیفە ئەبوبەکر بوو بە خەلیفەی موسوڵمانان بەڕێزیان لە حەق و دادپەروەری و یەکسانی بە توندی بە یەکسانی پابەندبوو.

لە ساڵی (٢٣)ی کۆچی لە دوای (١٠) ساڵ خەلیفایەتی کردن لە کاتی نوێژی بەیانی لە مزگەوت بە خەنجەرێکی ژەهراوی شەهیدکرا.

بەم جۆرە لە تەمەنی (٦٣) ساڵی دا کۆچی دوای کرد و لە تەنیشت گۆڕی پێغەمبەر (ﷺ) نێژرا.

## خەلیفە ( عثمان )ی کوڕی عەففان

عثمان کوڕی عەففان: بە سێیەم خەلیفەی موسوڵمانان دادەنرێت لە دوای کۆچی دوایی خەلیفە عومەری کوڕی خەطاب، هەر لەسەرەتای بانگەوازی ئیسلام بانگ کرا بۆ ناو بازنەی ئیسلامەتی، لە دوای پەسەندکردنی، خزمەتی ئیسلامی کرد و گشت سەروەت و سامانی پێشکەش بە ئیسلام کرد بە تایبەتی لە جەنگی ( تەبووك ) کە کاتی قات و قڕی و گرانی بوو.

گەورەیی خەلیفە عثمان(رضي الله عنه) بەسەر موسوڵمانانەوە نووسینەوەی پەرتووکی قورئانی پیرۆز بوو وە ناردنی بۆ وڵاتان و ناوچەکان.

لە دوای تەمەنێکی درێژ و پڕ خزمەت بۆ ئیسلام شەهید کرا لەلایەن چەند کەسێکەوە.

بەم جۆرە لە ساڵی (٣٥)ی کۆچی لە تەمەنی (٨٠) هەشتا ساڵی دا کۆچی دوای کرد.

## خەلیفە عەلی کوڕی ئەبوطالب:

خەلیفە عەلی کوڕی ئەبوطالب: ئامۆزای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)بوو هەر لە تەمەنی منداڵی موسوڵمان بوو، بە ئازایەتی و زانایی بە ناوبانگ بوو، دواتر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)( فاطیمە )ی کچی خۆی پێشکەش بە ئەو کرد لە دوای شەهید کردنی خەلیفە عوثمان ی کوڕی عەففان بوو بە خەلیفەی

ئیمانداران، هەر لە تەمەنی (٦٣) ساڵی کە دەکاتە بەرامبەر ساڵی (٤٠) کۆچی لە مزگەوت شەهیدکرا و کۆچی دوای کرد.

## سەلاحەدینی ئەیوبی

سەلاحەدینی یوبی: لە خێزانێکی کوردی خانەدان و پایەدارە، ئەم خێزانەش سەر بەهۆزێکی کوردە، کە یەکێکە لە ناودارترین هۆزەکانی کورد لە ڕوانگەی ڕەچەڵەك، ئەم هۆزەش بە ( ڕەواد )ی ناسراون.

صلاح الدین کوڕی نجم الدینی ایوبییە، کە لەساڵی (٥٣٢) کۆچی، کە دەکاتە (١١٧٣) ی زاینی، لە قەڵای تکریت لە دایك بووە، کە شارێکی کۆنەلە نزیك بەغدا.



## ڕەوشتی سەلاحەدینی ئەیوبی:

یەکەم: پارێزگاری و پەرستشی خوای گەورە.

دووەم: دادگەری.

سێ یەم: ئازایەتی.

چوارەم: بەخشندەیی.

پێنجەم: گرنگی دان بە جیهاد.

شەشەم: لێبووردەیی.

حەوتەم: ئارام گرتن و دان بەخۆداگرتن.

هەشتەم: ئەمەکداری.

نۆیەم: خاکی بوون.

دەیەم: هەلس و کەوتی جوامێرانە.

بەڕێزیان لە ساڵی (٥٨٩)ی کۆچی بە نەخۆشی ژانەسـك کۆچـی دوای کرد.

- *سەرچاوە: ژیانی گەورە پیاوانی ئیسلام .*



# عەقیدە ( باوەڕ )

## بنەماکانی دینی پیرۆزی ئیسلام:

جبرائیل ( فریشتەی وەحی ) پرسیار لە پێغەمبەر محمد(ﷺ) دەکات کە ئیسلام چی یە؟

پێغەمبەریش لە وەلاّم دا فەرمووی: ئیسلام بریتیە لە

١- باوەڕهێنان بەوەی کە هیچ خوایەك نی یە شایەنی پەرستن بێت تەنها (ﷲ) نەبێت، وە ( محمد ) یش پێغەمبەری خودایە و دەبێت فەرمانەکانی بە جیّ بهێنرێت. ئەمەش واتە بڕوامان بە((لاالـەالاالله محمد رسول الله))هەبێ.



٢- نوێژکردن:

واتە بە هەموو بنەماو مەرجەکانی و پێویستیەکانی بە دلّنیایی و ملکەچی یەوە.

٣- زەکات دان:

زەکاتیش بنەمایەکە لە بنەماکانی ئیسلام.

٤- ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان:

لەسەر هەموو مرۆڤێکی موسولّمان و ئیماندار پێویستە بە نیەتێکی پاکەوە واز لە هەموو شتێکی خراپ بهێنێت بۆ ئەوەی ڕۆژووەکەی قبوول بکرێت وە واز لە هەموو شتێك بهێنێت کە ڕۆژووەکەی پیّ بەتالّ دەبێت و دەشکێت.

## ئەو شتانەی کە پێویستە مرۆڤی موسوڵمان و ئیماندار لـەکاتی بەرۆژووبوون وازیان لێ بهێنێت:

١- خواردن و خواردنەوە بە گشتی.

٢- پاراستنی چاو و گوێچکە و زوبان و گشت ئەندامەکانی لە بەکارهێنانیان لە شتی خراپ.

٣- دوور کەوتنەوە لە سەرجێ ی کردن بۆ خێزانداران لەگەڵ خێزانەکانیان.

٤- ئەگەر بتوانیت پێویستە بچیت بۆ ماڵی خوا بۆ بەجێ هینانی فەریزەی حەج.



## بنەماکانی ئیمان ( باوەڕ):

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: بنەماکانی باوەڕ بریتیە لە:

١- باوەڕهێنان بە خودا: واتە بەوەی کە خودا دروستکەری گشت بوونەوەر و هەر ئەو شایەنی پەرستنە و کۆمەڵێ ناو و سیفەتی جوانی هەیە کە هەر ئەو بەتەنیا شایەنی ئەو تایبەتمەنیانەیە.

٢- باوەڕهێنان بە پەرتووکە ئاسمانیەکانی (تەورات و ئینجیل و زەبوور کە قورئانی پیرۆز حوکمی ئەوانی سڕیەوە)

٣- باوەڕهێنان بە فریشتەکان ( ملائیکە )کە پەروەردگار لە رووناکی (نور) دروستی کردوون و ئێمە نایان بینین.

٤- باوەڕهێنان بە پێغەمبەرانی خودا کە یەکەمیان ( نوح )ە. وە دواهەمینیان (محمد)ە ﷺ.

٥- باوەڕهێنان بە رۆژی دوایی کە ڕۆژی پاداشت و سزایە لەسەر کردەوەکان کە لەم دونیایە مرۆڤ کردیویەتی.

٦- باوەڕهێنان بەقەدەری چاك و خراپ.

## واتای ئیسلام:

ئیسلام بریتیە لەوەی خۆت بدەیتە دەست پەروەردگار بە یەکتا پەرستی و ملکەچی فەرمانەکانیەوە دوور بکەویەوە لە هاوەڵ دانان و هاوبەش بۆ خودا دانان.



## واتای ئیمان ( باوەڕ ):

ئیمان ئەوەیە کە دڵ باوەڕی پێیەتی و ئەندامەکانی بە کردەوە دەیسەلمێنن.

## خودات کێ یە؟

خودام (اللهٰ) یە کە درووستی کردووم و پەروەردەی کردووم و هەموو بوونەوەری پەروەردە کردووە بە بەخشندەیی خۆی وە هەر ئەو دەپەرستم.

## دینت کامەیە؟

دینم ئیسلامە، ئەویش ئەوەیە کەلە قورئان و سوننەتدا هەیە لەخودا پەرستی و بە جێ هێنانی فەرمانەکانی خودا و پێغەمبەر (ﷺ).

## پێغەمبەرەکەت کێ یە؟

پێغەمبەرەکەم محمد(ﷺ)ەکوڕی عبداللە کوڕی عبدالمطلب کوڕی هاشم. لە مەککە لەدایك بوە و دایکی ناوی ئامینە کچی وەهەب بووە.

## باوەڕهێنان بە مردن و زیندوو بوونەوە:

لەسەر هەموو کەسێکی موسولمان و ئیماندار پێویستە باوەڕ بە مردن و زیندووبوونەوەی خۆی بهێنێت لەبەرئەوەی بەشێکە لە باوەڕ بە خودا بوون.



ئەو کەسەی بوونەوەری لە نەبوون دروست کرد بۆ بوون تواناشی هەیە کە بوون بۆ نەبوون بگەڕێنێتەوە.

نیشانە باشەکانی کۆتایی مردوو چی یە؟

١- وتی لاالەالااللە محمد رسول اللە.

٢- مردن لەشەو یان لە رۆژی هەینی.

٣- شەهید بوون لە گۆڕەپانی جەنگ.

٤- مردن لەکاتی بەجێهێنانی کارێکی چاکە وەك شایەتمان و رۆژووگرتن، خێرکردن و سەدەقەکردن.

٥- مردن لەکاتی پاسەوانی لە پێناوی خودا.

٦- مردن به خنكان يان سوتان.

٧- تووش بوون به نەخۆشی سیل و مردنی بەهۆیەوە.

٨- مردن لەپێناو ئاین یان پاراستنی خۆی و ماڵ و منالّی و سامانی.

٩- مردنی ئافرەت لە زەیستانی دا.

## مافەكانی خودا بەسەر بەندەكانی:

- مافەكانی خودا بەسەر بەندەكانی بریتیە لە جێ بەجێ كردنی هەر فەرمان و قەدەغەكراوێك كە هاتووە لە قورئان و فەرموودەدا.

## فەرمانەكانی خودای گەورە:

أ- باوەڕهێنان بە خودای تاك و تەنیاو شایەتی دان بە ئەو.

ب-بە جێ هێنانی نوێژ.

ت-بەجێ هێنانی رۆژوو ( رۆژووگرتن ).

پ-زەكات دان.

وە. ....



## قەدەغەكراوەكان:

أ- دزی كردن.

ب-كوشتنی مرۆڤ و ئاژەڵ.

ت-بێڕێزی كردن بەرامبەر بە دایك و باوك.

وە. ...

## مافەکانی پێغەمبەر محمد(ﷺ):

بەجێ هێنانی سوننەتەکانی وەکو:

أ- سیواك کردن.

ب-نوێژی سوونەت کردن.

ت-چاکەکردن لەگەڵ خەڵك.

پ-سەلام کردن.

وە. ...

## گەورەترین ماف لە دوای مافی خودا و پێغەمبەر (ﷺ) چی یە؟

١- لەسەر پیاوان:

مافی دایك و باوکە یەکەم جار دایك پاشان باوك.

لەسەر ئافرەتان:

مافی پیاوەکەیەتی بەسەریەوە.



## خودا لە کوێ یە؟

خودا لەسەر عەرشە و لەسەرووی ئاسمانەکانیش، واتە خودای گەورە لە هەموو شوێنێکە و لەگەڵماندایە بە زانست و زانیاری خۆی دەمانبینێ و گوێی لێمانە و پەی بە گشت نهێنی و ئاشکراکانمان دەبات و دەزانێت.

## سوودی یەکتاپەرستی چی یە؟

سوودی یەکتاپەرستی ئەوەیە کە مرۆڤی موسوڵمان و ئیماندار پاك و خاوێن دەبێتەوە و دڵنیا دەبێت لەوەی کە دوور کەوتۆتەوە لە دۆزەخ و دەچێتە ناو بەهەشتێکی جوان و ڕازاوە و پاك کە هەتا هەتاییە.

## مەرجەکانی موسوڵمان بوون:

مرۆڤ نابێت بە موسوڵمانی راستەقینە تاوەکو ئەم مەرجانەی تێدا نەبێت.

١- تا بڕوا بە لاالـەالا الله محمد رسول الله نەهێنێت و بە پێ ی فەرموودەکانی ئەوانیش ژیان بەڕێوەنەبات.

٢- بە ڕاست دانان هەرچی یەك کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی و گوێڕایەڵی و بەکارهێنەری بێت لە ژیانی هەروەها سوونەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بەجێ بهێنێت بەوپەڕی توانای.

٣- دژمنایەتی کردنی هاوەڵدانەران و بێ بڕواکان.

٤- ئامۆژگاری کردنی خەڵك.

## واتای نییەت:

کاتێك کە کردەوەیەك یان قسەیەك دەکەیت بە دڵەوە ئەنجامی بدەیت نەك تەنها بەزمان.

مەرجەکانی وەرگرتن ( قبوول بوون ) ی کردەوەی چاك:

بۆ وەرگرتنی کردەوەی چاك لە مرۆڤی موسوڵمان پێویستە ئەم مەرجانەی خوارەوەی تێدا بێت:

١- باوەڕهێنان بە خودا، هەروەها کردەوەکانیشی هەرلەبەر ویست و ڕەزامەندی خودا بێت.

٢- کردەوەکان بە دڵسۆزی بێت و لە پێناوی خودا بێت و دووربێت لە ڕیابازی و خۆ بەدەرخستن.

٣- ڕازی بوون بەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێکردووون.

٤- بەتاڵ نەکردنەوەی کردەوەی چاك بە قسە و کردەوەی وەك ( پاڕانەوە لە مردووان، یان هاوار بۆ بردنیان، یان بەو باوەڕی کە ئەوان لە خودات نزیك دەکەنەوە و بەو هۆیەشەوە خێر و سەدەقەیان بۆ بکەیت.



## مەرجەکانی وەرگرتن ( قبولْ کردن ) ی تەوبە لەلایەن خودا:

١- دڵسۆزی: پێویست بە دڵسۆزی پاك و تەنیا لە بەر خودای گەورە تەوبە بکات هەر لە داوای لێبووردن و لیْ خۆش بوون بکات نەك لەبەر کەسێکی دیکە و شتێك.

٢- پەشیمان بوونەوەی تەواو و تەبەکردن لە تەواوی ئەو کردەوە خراپەو نابەجێ یانەی کە کردوویەتی.

٣- وازهێنان و دوورکەوتنەوە لەوشتەی کە تەوبەی لیْ کردووە.

٤- لە دوای تەوبەکردن، ئەگەر ماف یان ئەمانەت یان شتێکی کەسێکی دیکەی لەلاماوە پێویستە بیداتەوە.

٥- داوای گەردەن ئازادی لەو کەسانە بکات کە ئازار یـان بـێ ڕێـزی پێکردوون.

٦- پێویستە و واباشترە تەوبە پێش سەرەمەرگ و هەڵاتنی خۆر بێت.

## ئەرك و پێویستیەکانی سەرشانی مرۆڤـی موسـوڵمان ئیمانـدار بەرامبەر بە خودا و پێغەمبەر (ﷺ).

١- باوەڕهێنان بە خودا واتە ( لااله‌الا الله محمد رسول الله ) وە خـۆش ویستنیان و پاڕانەوە تەنیا لە خودای گەورە.

٢- ئیش پێکردن و خۆش ویستنی قورئانی پیرۆز واتە: فەرموودەکانی خودا و ئایەتەکانی، فەرمان بە چاکەکردن و ڕێگرتن لە خراپە و حەڕام.

٣- ئیش پێکردن و خۆش ویستنی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ).

٤- حوکم کردن بەبەرنامەی خودا و سـوونەتی پـێغەمبەر (ﷺ) وە باوەڕمان وابێت کە هەموو یاسایەك جگە لە یاسا و بەرنامەی خودای تاك و تەنیا بە خێرتر و ڕاستتر نی یە.

٥- حەزمان لە یەکتاپەرستی بێت، ئەو کەسانەشمان خۆش بوێـت کـە لەسەر ئەو ڕێبازە و ڕێگای ئیسلام دەڕۆن وە رقمان لە کافرو هاوەڵدانـەران ( موشریکەکان ) بێت.

٦- فەرمانەکانی خودا و پێغەمبەر بکەینە بەرنامەی ژیان و خۆشمـان بوێت و بەوپەڕی توانا بلاّویان بکەینەوە.

٧- خودا پاشان پێغەمبەرمان لـە هەمووکـەس خۆشـتر بووێـت، لـە خۆمان و دایك و باوك و خوشك و برا و خێزان و منداڵمان.

٨- باوەڕمان وابێت کە پـێغەمبەر محمـد (ﷺ) نـێردراوی خودایـە و فەرمووددەکانی بە ڕاست بزانین و خۆشمان بوێت و ڕێزیان لێ بگرین.

٩- بەرگری بکەین لە دین و ئیسلام وسوونەتی پێغەمبەر (ﷺ) بـە ماڵ و گیان و منـاڵ و خێزانمان.

١٠- ڕەوشتمان بریتی بێت لە ڕەوشـتی پـێغەمبەر (ﷺ) هـەروەها جگە لە خودا لە کەسی دیکە نەپاڕێینەوە، ئەگەر پیاو چاك یان پێغەمبەر یان هەر کەسی دیکە چونکە بە هاوبەشی دانـان ( شـریك ) دادەنرێـت وە لەئەنجامدا کردەوەی چاك دەسڕێتەوە.

## بۆچی خودا قورئانی ناردۆتە خوارەوە؟

خودای گەورە قورئانی ناردۆتە خوارەوە بۆ مرۆڤ بۆ ئەوەی کـاری پـێ بکەن و لەسەری بڕۆن.

لەسەر باوەڕدار پێویستە کە شوێنی قورئان و بەرنامەی خودا بکەوێت بۆ ئەوەی بە خۆشی و بەختەوەری دنیاو قیامەت بگات.

## بۆچی قورئان بخوێنینەوە؟

بۆ تێگەیشتن و لێ وردبوونەوە و کارپێکردنی بە واتایـەکی دیکـە بـۆ ئەوەی ببین بـە مرۆڤـێکی موسـوڵمان و ئیمانداریـێکی تـەواو و دروسـت، هەروەها بۆ ئەوەی گومڕاو سەرگەردان نەبین و بـەردەوام وشـیارو ئاگـادارو زیرەك بین لە ژیان.



## ئایا قورئان بۆ مردوانە یان بۆ زیندوان؟

خودای گەورە قورئانی بۆ زیندوان ناردووە بۆ ئەوەی بیکەن بە بەرنامەی ژیانیان نەك بۆ مردوان کە کەسانێکی مردوون و لە ژیان دابڕاون.

## گەورەترین و جوانترین و بەڕێزترین خۆشەویستی چی یە؟

بێگومان گەورەترین و جوانترین و بەڕێزترین خۆشەویستی خۆشەویستی خودا و پێغەمبەردکەیەتی.

## پەرتووکی پیرۆزی قورئان:

قورئان پەرتوکێکە بۆ پێغەمبەری ئیسلام محمد(ﷺ) دابەزیوە، بۆ گەیاندنی بە خەلك بۆ دوورکەوتنەوە لە بت پەرستی و بوون بە خودا پەرستی تاقانە.

## ئادابی خوێندنەوەی پەرتووکی پیرۆزی قورئان:

١- بوونی دەست نوێژ.

٢- لەش خاوێن بوون.

٣- گوتنی ( أعوذ بالله من الشیطان الرجیم ) لە کاتی خوێندنەوەی.

٤- خوێندنەوەی بە شێوەی ژمار ژمار و پلە پلە.

٥- بیرکردنەوە و ڕامان لە ئایەتەکانی قورئان لەکاتی خوێندنەوە و گوێگرتن.

٦- بێدەنگ بوون و بە هێمنی بوون لەکاتی خوێندنەوەی قورئان.

## جبرائیل ( فریشتەی وەحی ) کێ یە؟

جبرائیل ناوی فریشتەی وحی یە کە واتاکەی بە ( پاڵەوان یـان پیـاوی خودا) دێت. قورئانی پیرۆز لەڕێگای فریشتە جبرائیل کە لەلایـەن خـوداوە بۆ سەر پێغەمبەر محمد (ﷺ) دابەزیوە.

## مەککە چیە؟

مـەککە ئەو شارەبوو کە پێغەمبەر محمد (ﷺ) لەوێ دەژیاو بـوو بـە پـێغەمبەر، کـە مـاوەی (١٣) سـاڵ لـەو شـارە سـەرقالی بانگـەوازی و بلاّوکردنەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بوو.



## مەدینە چیە؟

مـەدینە ئەو شارەیە کە پێغەمبەر محمد (ﷺ)لـە دوای ئـەوەی (١٣) سێزدە ساڵ لە مەککە بوو، بۆ ئەو شارە کۆچ ( هیجرەت )ی کرد. مـاوەی (١٠) دە ساڵ لە مەدینە مایەوە و سەرقلی بلاوکردنـەوەی ئـاینی پـیرۆزی ئیسلام بوو.

## حیرا چیە؟

حیرا ئەشکەوتێکە لە (٦) شەش کیلۆمەتری باکوری شاری مەککـە، کە پێغەمبەر محمد (ﷺ)زۆر جار بۆ ئەوێ دەڕۆیشت.

## مەبەست چیە لە سورەتەکانی مەککی ؟

ئەو سورەتانەن کە لە شاری مەککە بەسەر پێغەمبەر (ﷺ)دابەزیوە، ژمارەی ئەو سوڕەتانەش (٦٨) سورەتە وە زیاتر ئەم سورەتانەش باس لە بیروباوەڕ و یەکتاپەرستی خودا دەکات.

## مەبەست چیە لە سورەتەکانی مەدەنی ؟

ئەو سوڕەتانەن کە لە شاری مەدینە بەسەر پێغەمبەر محمد (ﷺ)دابەزیوە، ژمارەی ئەو سوڕەتانەش (٢٨) سوڕەتە وە زیاتر ئەم سوڕەتانەش باس لە حوکمە شەرعیەکان دەکات.

## قورئانی پیرۆز:

قورئان دابەشی (٣٠) جز کراوە کە لە (١١٤) سەدو چواردە سوڕەت پێکهاتووە.

## ناوی پەرتووکە ئاسمانیەکان:

١- قورئان کە دواهەمین پەرتووکی ئاسمانیە و بۆ سەر پێغەمبەری ئیسلام محمد(ﷺ)دابەزیوە.

٢- صحف کە یەکەمین پەرتووکی ئاسمانیە بۆ سەر پێغەمبەر أبراهیم (علیە السلام)دابەزیوە.

٣- تەوڕات دووەمین پەرتووکی ئاسمانیە بۆ سەر پێغەمبەر موسی (علیه السلام)دابەزیوە.

٤- زەبوور کە سێیەمین کتێبی ئاسمانیە بۆ سەر پێغەمبەر داود (علیه السلام)دابەزیوە.

٥- ئینجیل چوارەمین پەرتووکی ئاسمانیە بۆ سەر پێغەمبەر عیسی (علیه السلام)دابەزیوە.

## یەکەمین و دواهەمین پێغەمبەر کێ یە؟

پێغەمبەر ئادەم (علیه السلام) یەکەمین پێغەمبەر و پێغەمبەر محمد (ﷺ) دواهەمین پێغەمبەری خودای گەورەیە.



## ئیسراو میعراج چی یە؟

ئیسراو میعراج بەگشت ئەو سەفەرە دەڵێن کە پێغەمبەر محمد (ﷺ) لە شاری مەککە بەشەو بە هێزو ویستی خودای گەورە چوو بۆ مزگەوتی ( ئەقسا ) لە ناوچەی شام ولاتی ( فەڵەستین ) و لەوێوەبەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمانەکان.

*سەرچاوە:*

*پەرتووکی ( ئیمان )، مامۆستا حسێن قادر پێنجوینی.*

# ئادابی ژیان

## مزگەوت

مزگەوت ماڵی خودای گەورەیە، مزگەوت شوێنی هێمنی وَ ئاسایشە بۆ دڵەکان، مزگەوت شوێنی عیبادەت و خواپەرستیە.

کەواتە مرۆڤی موسوڵمان کە دەڵێت خودام خۆش دەوێت، ئەوا پێویستە لەسەری کەماڵی خوداشی خۆش بوێت. ئەو خۆشویستنەش بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

١- پاك و خاوێن ڕاگرتنی ماڵی خودا کە مزگەوتە.

٢- پاراستنی هێنی و ئاسایشی ناو مزگەوت.

٣- گفتوگۆنەکردن لە بابەتی بازار و مامەڵە و سەودا لەناو مزگەوت.

٤- خۆشویستنی مزگەوت بە ناخ و بە رۆح و دڵ.

٥- دەنگ بەرزنەکردنەوە بەناوی عیبادەت و زیکر.

٦- ڕێگەنەدان بە شێت بۆ چوونە ناو مزگەوت.

٧- ڕێگەنەدان بۆ بانگەوازی دۆزینەوەی بزربوو.

٨- نەڕشتنی ئاوی لووت و دەم لە ناو مزگەوت.

٩- لەکاتی چوونە ناو مزگەوت، پێویستە یەکەم جار قاچی راست بخەینە ناو مزگەوت و ئەم نزایەش بخوێنین: (( اللَّهُمَّ افْتَحْ لي أَبْوابَ رَحْمَتِكَ)) واتە: خودایە گیان دەرگای رەحمەتی خۆتم لێ بکەوە.

١٠- لەکاتی هاتنە دەرەوە لە مزگەوت، پێویستە یەکەم جار قاچی چەپ بخەینە دەرەوەی مزگەوت و ئەم دوعایەش بخوێنین: ((اللَّهُمَّ إني أسألك مِنْ فَضْلِك )) واتە: خودایە من بەراستی داوای خێرو چاکەت لێ دەکەم.

پێغەمبەر (ﷺ) فێرمان دەکات کە هەرکەسێك لە رۆژی پێنج شەممە و شەوی هەینی مزگەوت پاك و خاوێن بکاتەوە، هەر چەند بستێك خۆل و زبلیش بێت، ئەوا خودای گەورە لە گوناهەکانی دەبوورێت و خۆشی دەوێت هەروەها فێرمان دەکات کە هەفتەی رۆژێك مزگەوت بۆن خۆش بکەن و بڕازێننەوە، لە هەمان کاتیش لە کاتی هاتنە دەرەوە لە مزگەوت پێویستە لەسەر مرۆڤی موسوڵمان بە هێمنی و هێوری لە شوێنی خۆی هەڵبستی و قاچ و شان لە برا موسوڵمانەکانی نەدات.

## سیلەی رەحم ( پەیوەندی سۆزدارانە )

- لە روانگەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بە هاتوو چۆکردن و پەیوەندی نێوان خزم و کەس و کار، وەسەردانی دۆستان و هاوڕێیان دەڵێن ((سیلەی رەحم)).

- وە برین و پچراندنی پەیوەنی و هاتوو چۆکردنی نێوان خزم و کەس و کار، وە دۆستان و هاوڕێیان دەڵێن ( قطع الرحم ) واتە: بڕینی پەیوەندی سۆزدارانە.

- له روانگەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بە جێ هێنانی سیلەی رەحم لە واجبات و فەرزە گرنگەکانە لەبەرئەوەی بە جێ هێنانی سیلەی رەحم رق و خەم و دوژمنایەتی ناهێڵێ و خاوێنی دەکاتەوە، هەروەها بەجێ هێنانی سیلەی رەحم تەمەنی مرۆڤ درێژدەکات. بە پێچەوانەوە برینی سلیەی رەحم لە لای خوای گەورە بە گوناهێکی گەورە دادەنرێت، کە دەبێتە کورت بوونی تەمەن و تووش بوون بە نەخۆشی و دڵڕەشی.

- پێغەمبەری خودا محمد(ﷺ) فێرمان دەکات کە هەر کەسێك دەیەوێت خودا مالی زۆر بکات و تەمەنی درێژ بکات، ئەوا باسیلەی رەحم بەجێ بهێنێت.

بۆنمونە: ئەگەر کەسێك لە خۆشی و ناخۆشی کۆمەڵە کەسێك بەشداربێت ئەوا بەهەمان شێوە ئەوانیش لە خۆشی و ناخۆشی ئەوکەسە بەشدار دەبن، بە پێچەوانەش.

## رێزگرتن

- رێزگرتن لە کەسێك یان شتێك پێش ئەوەی گەورەیی و بەرێزی کەسە رێزلێگیراوەکە یان شتە رێزلێگیراوەکە بگەیەنێت، ئەوا گەورەیی و بەرێزی ئەو کەسە رێزگرە دەگەیەنێت کە رێزی لەوکەسە یان شتە داناوە.

ئەو شتانەی کەپێویستە لەسەر شانی مرۆڤی موسوڵمان و ئیماندار رێزیان لێ بگرێت:

١- رێزگرتن لە خودای گەورە و قورئان.

٢- ڕێزگرتن لە پێغەمبەر محمد(ﷺ).

٣- ڕێزگرتن لە دایك و باوك.

٤- ڕێزگرتن لە دراوسێ و خەلك و مامۆستا.

٥- ڕێزگرتن لە مزگەوت.

٦- ڕێزگرتن لە ئاو بەرد و دار و شتومەك.

## جگەرە کێشان

- لە ڕوانگەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام جگەرە کێشان کارێکی ناشرین و نارێك و حەرامە.

- لە ڕوانگەی زانست و زانیاری پزیشکیش جگەرەکێشان دەبێتە هۆی تووشبوونی مرۆڤ بە نەخۆشی مێشك و پێست و ددان و هتد....

- لە ڕوانگەی ماددی جگەرە کێشان دەبێتە هۆی تووش بوون بە زەرەرێکی گەورەی ماددی.

کەواتە: بۆمان دەردەکەوێت کە جگەرەکێشان جگە لە زەرەر و نەهامەتی هیچ سودو قازانجی نیە.

## بە هێمنی قسە کردن

- مرۆڤی موسولمان وئیماندار دە بێت بەبێ هۆکار قورگ و گوێی خۆی تووشی نەخۆشی نەکات، هەروەها پێویستە بزانێت هات و هاوار و دەنگی بەرزی گوێگر و قسەکەر لە بیرکردنەوەی ڕاست و دروست دوور

دەخاتەوە و نەخۆش نەخۆشتر دەكات و لە ژمار كردن و ژمێریاریش هەڵـە دەكات.

- لەسەر هەموو مرۆڤێكی موسوڵمانی ئیماندار پێویستە لـە كـاتی تێپەربوون لـە لـێوار و تەنیـشتی مزگـەوت و نەخۆشـخانە و خوێـندنگاو كۆڵانــەكانی گەڕەكــەكان دەنگــی ڕادیــۆ یــان ســیدی ئۆتۆمبــێلّ و ماتۆرسكیلەكەی كەم بكاتەوە و تا بكرێت هۆرنــەش بەكارنەهێنــێت. نــزم كردنەوەی دەنگ و چاو داپۆشین و بەڕێگادا ڕۆیشتن بە شێوەی مــام ناوەنــد لە ئاماژەكانی ئیمانە.

## سەلام كردن



- لەڕوانگەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەسەر هەر تاكێكی موسوڵمان و ئیماندار واجبە كە سەلام لە دایك و باوكی و دۆستان و هاوڕێیان و خـەڵك بكات

- سەلام كردنی مرۆڤی موسوڵمان و ئیماندار بەم شێوەیە:

- ئەو كەسەی كە سەلام دەكات پێویستە بڵێت:

( سلام عليكم ورحمه الله وبركاته )

واتە: سەلام و میهرەبانی و بەرەكەتی خوات لەسەر بێت.

ئەوكەسەش كەوەلامی سەلام كردن دەداتەوە پێویستە بڵێت:

( وعليك السلام ورحمه الله وبركاته )

واتە: سەلام و میهرەبانی و بەرەكەتی خوذا لەتۆش بێت.

- سەلام کردن سوننەتە و وەڵاّم دانەوەشی واجبە. ئەوکەسەی کە سەلام دەکات (٩) خێری لەلایەن فریشتەکان و خوداوە بۆ دەنووسرێ، ئەو کەس و مرۆڤەش کە وەڵاّمی سەلام دەداتەوە (١) خێری بۆ دەنووسرێ لەلایەن فریشتەکان و خوداوە.

## پژمین

- پژمین بە یەکێك لە ئیش و کارە سروشتیەکانی لەشی مرۆڤ دادەنرێت کە بە هۆیەکی ویستن یان نەویستن دروست دەبێت. هەندێك کات کە مرۆڤ لەبەرامبەر خۆر دەوەستێت دەپژمێت. هەندێك جار بەهۆی نەخۆشی مرۆڤ دەپژمێت و هتد....

- هەندێك خەڵك هەن لەکاتی پژمین شەقاو لە دوای شەقاو ناهاوێژن، ئەگەر پژمین هۆکارێکی نادیاری هەبووبایە، ئەوا دەمانووت: لەوانەیە ئێوە راست بکەن. کەواتە مرۆڤی موسوڵمان و ئاقڵ و ژیر لە ڕوانگەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام پێویستە لەکاتی پژمین کە تەواوبوو بڵێت ( الحمدلله ) ئەگەر کەسێکیش پژمی با کەسی تەنیشتی یا برادەرەکەی پێ ی بڵێت ( یرحمك الله).

- هەرکەسێك لە کاتی پژمین ئیش و کاری ڕابگرێت و ڕابوەستێت و نەچێتە سەفەر یان هەر شتێکی تر ئەوا ئەو کەسە بە نەزان و نەفام دادەنرێت لەبەر ئەوەی نە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام و نە لە چوار چێوەی زانست و زانیاری پژمین بە شتێکی خراپ دانانرێت.

- ئاینی پیرۆزی ئیسلام دەڵێت پژمین ئامـاژەی سـاغ و سـەلامەتی لەشی مرۆڤە.

- زانست و زانیاری دنیاش دەڵـێت: پـژمین هـەموو ماسـولکەکانی لووت دەجولێن و خاودەبنەوە، ئەوەش وەکو وەرزش کردن (یـاری کـردن)ی ماسولکەکانی لووت وایە کە زۆر بەسوودە بۆیان.

## هەڵسووکەوت لەگەڵ خەڵك

- لە ڕوانگەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەڵسووکەوت لەگەڵ خەڵك بەم شێوەیەی خوارەوەیە:



١- سەلام کردن و تەندروستی پرسین.

٢- تەوقەکردن و زەردەخەنە.

٣- لەکاتی گوێ گران بوون یان نەخۆشی گـوێ ی کەسـی بەرامبـەر، پێویستە هێمن و ئاسایشی خۆمان بپارێزین وەلە سەلامەتی و تەندروسـتی بەرامبـەرەکەمان بپرسین.

٤- دڵ خۆش کردن و قسـەی خۆش و باش کردن.

٥- بە نەرمی قسە کردن و بە هێمنی وتووێژکردن.

٦- ئازار نەدان و گاڵتەنەکردن بە خەڵك.

٧- رق لێ نەبوونەوە و بوغز و کینە نەبوون لە بەرامبەر خەڵك.

## پاك و خاوێنی

- پاك و خاوێنی شتێك یان كردارێكە لەگەڵ ژیانی رۆژانە پەیوەندی دارە، پاك و خاوێنی لەگەڵ خەو و خۆراك و جل و بەرگ و نوستن و هەناسە هەڵكێشان پەیوەندی هەیە. لە ڕوانگەی كۆمەڵایەتی هەموو شوێنێكی بچووك و گەورە لە خۆ دەگرێ.

- لە بابەتی پاك و خاوێنی، لەسەر مرۆڤی موسوڵمان و ئیماندار پێویستە پاك و خاوێن بێت لە:

١- غووسلی رۆژی هەینی (جومعە).

٢- پاك و خاوێن ڕاگرتنی دووكان.

٣- **پاك و خاوێن ڕاگرتنی ماڵ.**

٤- **پاك و خاوێن ڕاگرتنی قژ.**

٥- **نینۆك كردنی دەست و پێ ( قاچ ).**

٦- پاك و خاوێن راگرتنی ددانەكان.

٧- پاك وخاوێن ڕاگرتنی جل و بەرگ و پێڵاو.



## بەجێ هێنانی غووسلی رۆژی هەینی:

غوسلی رۆژی هەینی بریتیە لەوەی پیاو و ئافرەت دەبێت لە رۆژی هەینی لەكاتی پێش نوێژی بە كۆمەڵی نیوەڕۆ خۆیان بشۆن بە نیەتی غوسلی رۆژی هەینی ئەو خۆشوشتنەش لەبەر ئەوەیە كە لەو رۆژە

موسوڵمانان و ئیمانداران کۆدەبنەوە لە مزگەوت کە بۆنی ئارەقـە و چـڵك موسوڵمانان ئەزیەت نەدات، هەروەها سوننەتێکی پێغەمبەر محمـد (ﷺ) .٥

ئەگەر لە رۆژی هەینی زانیمان کە ئاو دەست ناکەوێت ئەوا پێویـست لەرۆژی پێنج شەممە ئەو غوسلە جێ بەجێ بکەین.

## پاك و خاوێن ڕاگرتنی دووکان.

لەســەر هــەموو دوکاندارێــکی ئیمانــدار و موســوڵمان پێویــستە کــە دووکانەکەی خاوێن ڕابگرێ و بیشوات و شتەکان پاك بکاتەوە.

شتێکی گرنگی دیکەش ئەوەیە کە لەسەر هەموو خـاوەن کارێـك لـە بەڕێوەبەری دووکان، یان کارگە. پێویستە ئەو کەسەی کە دایدەمەزرێنـێت ئەوا تایبەتمەندی پاك و خاوێنی تێدا بێت.

## پاك و خاوێن ڕاگرتنی ماڵ:

شوشـــتن و گـــسك لـــێدان و پـــاك و کردنـــەوەی مـــاڵ دەبـــێتە هـــۆی دوورکەوتنەوە و نەمانی نەخۆشی. هەر خێزانێك ماڵکەیان خاوێن ڕابگـرن و پێش دەرگاکانیان گسك بدەن و ئەوا خوای گـەورە ئـەو خـێزانەی خـۆش دەوێت.

پێغەمبەری خودا محمـد(د.خ) فـێرمان دەکـات کـە بەهەشـت تـەنیا شوێنی خەڵکی پاك و خاوێنە، پاك و خاوێنیش لە هێمای باوەڕەوەیە.

## پاك و خاوێن ڕاگرتنی قژ:

لەسەر مرۆڤی موسوڵمان و ئیماندار پێویستە قژی کەم و مام ناوەند چاك بکات و بەرێکی بیشوات و شانەی بکات.

ئەگەر کەسێك لە توانای دانەبوو قژی سەری جوان و پاك ڕابگرێ ئەوا پێویستە بیتراشێ بۆ ئەوەی پاك و خاوێن ڕاگرتنی بۆ ئاسان بێت.

هەروەها پاك کردنەوەی مووی ژێر پیل ( هەنگل، باڵ )وە ژێر ناوك (شەرمگا) پێویستە لە (٤٠) ڕۆژ زیاتر تێنەپەڕێت.

## نینۆك کردنی دەست و قاچ:

لە ڕوانگەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، پێغەمبەر محمد (ﷺ) فێرمان دەکات کە ژێر نیکۆکەکان شوێنی شەیطانە، کەوا پێویستە نینۆکەکانمان بەبەردەوامی کورت بکەینەوە بۆ ئەوەی شەیطان نەبێتە هاوڕێمان.

## پاك و خاوێن ڕاگرتنی ددانەکان:

ئەگەر کەسێك ددانەکانی نەشوات ئەوا ناتوانرێ ناوی مرۆڤی لێ بنرێ، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر محمد(ﷺ) فێرمان دەکات و پێمان دەڵێت لەسەر مرۆڤی موسوڵمان و ئیماندار واجب و پێویستە ددانەکانی بشوات، واتە ئاو و سیواك بەکارهێنان.

لەسەردەمی ئەمرۆش دەتوانین بە مەعجون و فلچە و سیواك ئەو ئیش و کارە بکەین.

لەسەر هەموو کەسێك پێویستە لە دوای نان خواردنی بەیانی وە دوای نان خواردنی ئێوارە ( کاتی نووستن ) بـە فلـچە و مـەعجوون ددانـەکانی خاوێن و پاك بشوات وە لە کاتی بـەجێ هـێنانی هـەر (٥) پـێنج فـەرزی نوێژەکانیش سیواك بەکار بهێنێت.

## پاك و خاوێن ڕاگرتنی جل و بەرگ و پێڵاو:

لەسەر مرۆڤی موسوڵمان و ئیمانـدار واجبـە و پێویـستە کـە جـل و بەرگی خاوێن ڕابگرێ و پێڵاوەکانی بۆیاغ یان بـە پـەڕۆ خاوێـن بکاتـەوە. پێغەمبەری خودا فـێرمان دەکـات کـە عەبـدی ناپـاك و پـیس و پۆخـەڵ بەراستی عەبدێکی خراپـە، خـودای گـەورە پـاك و جوانـە کەسـی پـاك و خاوێنیشی خۆش دەوێت.

## خەوتن و لە خەوهەڵسان:

- خەوتن یەکێکە لە نیشانەکان یان موعجیزەکانی خودای گەورە کە مرۆڤ بە خەوتن خانەکانی مێشکی دەحەسێتەوە و پشووی خۆی وەردەگرێ.
- لەسەر مرۆڤی موسوڵمان و ئیماندار پێویـستە لـە پـێش خـەوتن بچێتە سەر ئاو، دواتر بڕوات بۆ خەوتن.
- شێوازی نووستنی مرۆڤی موسوڵمان بەم شێوەیە:

١- چوونە سەر ئاو.

٢- شوشتنی ددان و دەست و چاو بە فلچەو مەعجون و ئاو و سابون.

٣- دەست نوێژ هەڵگرتن.

٤- خوێندنی سورەتی (الاخلاص، الفلق، النّاس ) هەریەکە ٣ جار.

٥- زیکری ( سبحان، الحمدلله، الله اکبر ) هەریەکە ٣٣ جار، (١)جار (لااله الا الله).

٦- دواتر نووستن لەسەر لاتەنیشتی راست.

- هەروەها نابێت مرۆڤ لەسەر بانێك بنوێت کە ستارە یان بەربەستێکی نەبێت لەبەر ئەوەی مەترسی کەوتنە خوارەوەی لێدەکرێت کە لەوانەیە ببێتە هۆی مردن یان نەخۆش کەوتن و هتد....

- بە هەمان شێوە پێویستە مرۆڤ لەکاتی هەڵسان لە خەو دەست و دەم و چاوی بە ئاو و سابوون بشوات. دواتر دەست بە نان خواردن یان یان هەر شتێکی دیکە بکات.

## بە ڕێگەدا ڕۆیشتن:

- لە ڕوانگەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام مرۆڤی موسوڵمان و ئیماندار نابێت بە شێوەی خۆبەزل زانین و خۆ بەگەورە زانین بە ڕێگادا بڕوات و لە هەمان کاتیش خەڵك بە بچوك و نزم بزانێت، لەبەرئەوەی ئەگەر وای کرد ئەوا ئەو کەسە تووشی گوناهێکی زۆر گەورە دەبێت و خودا و پێغەمبەر لێی نارازی و تووڕە دەبن.

- ئەو کەسەی بە شێوەی خۆ بەزل زانی و خۆبەگەورە زانی بەڕێگادا دەڕوات ئەوا دوو زەرەر دەکات:

یەکەم: خۆشەویستی خوای گەورە لە دەست دەدات.

دووەم: خۆشەویستی خەڵك لەدەست دەدات و ڕێزی لای خەڵك نامێنێت.

- بە شێوەیەکی گشتی بە ڕێگادا ڕۆیشتنی مرۆڤی موسوڵمان و ئیماندار لە ڕوانگەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەم شێوە دەبێت:

١- بە شلی و مەلۆلی و ناز و لەنجە بەرێگادا نە ڕۆیشتن.

٢- بە بێ هێزی و مانوویەتی بە ڕێگادا نە ڕۆیشتن.

٣- بە خێرایی و بە پەلە بە ڕێگادا نەڕۆیشتن.

٤- ڕاستەخۆ بەرامبەر خۆر بەڕێگادا نەڕۆیشتن.

٥- بەسەر نزمی و هەژاری بە ڕێگادا نەڕۆیشتن.



٦- لەکاتی بەڕێگادا ڕۆیشتن ئەگەر بەرد یان پارچە دارێك لەسەر ڕێگا بوو ئەوا پێویستە لای بدەین.

- بە شێوەیەکی گشتی خودا و پێغەمبەر محمد(ﷺ) فێرمان دەکەن کە لە کاتی ڕۆیشتن بە ڕێگادا مامناوەندی و نەرموونیانی بەکاربهێنین، لەبەر ئەوەی خێرا بەڕێگادا ڕیشتن گەورەیی و ڕێزی موسوڵمان و ڕوونـاکی ڕوخساری دەکوژێنێتەوە.

هەروەکو لە خاڵی (٤) چوارەم باسمان کرد پێغەمبەر محمد(ﷺ) فێرمان دەکات کە بەرامبەر بە خۆر بە ڕێگادا نەڕۆین، لەبەرئەوەی بۆنی دەمان ناخۆش و ڕەنگی ڕوخسار ناشرین و جل و بەرگ کۆن و نەخۆشی نادیار بلاو دەکاتەوە (ئاشکرا دەکات)

هەروەها باش نی یە و نابێت ئافرەتان لە نێوەندی شەقام و کۆلانەکان بەرێگادا بڕۆن، بەڵکو پێویستە لە لێواری ( قەراغی ) شەقام و کۆلانەکان بەرێگادا بڕۆن.

## قرپ هێنانەوە

- قرپ هێنانەوە بە یەکێك لە ئیش و کارە سروشتیەکانی لەشی مرۆڤ دادەنرێت. قرپ هێنانەوە هەندێك کات بە هۆی زۆر خواردن دەبێت، هەندێك جاریش بەهۆی دیکە دەبێت.
- هەرکەسێك قرپی هێناوە ئەوا پێویستە دەنگی قرپ هێنانەوەی هێواش و نزم و کورت بکاتەوە و دەمی بۆ ئاسمان نەبات و ڕای نەگرێ.
- قرپ هێنانەوەی دوای نان خواردن ئاماژەی ئەوەیە کە ئەو خواردنەی کە خوراوە گەیشتۆتە شوێنی خۆی بۆ سوود وەرگرتن، کەوایە پێویستە لە دوای هەر قرپ هێنانەوە شوکر و سوپاسی خودای گەورە و تاك و تەنیا بکەین بە وتنی (الحمدلله).



## جل و بەرگ پۆشین

- لە ڕوانگەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام خۆ پۆشتەکردن و جل و بەرگ لەبەرکردن واجب و پێویستە، لەبەرئەوەی پێغەمبەر محمد(ﷺ) فێرمان دەکات کە بە ڕووتی و بێ جل و بەرگ ژیان بەسەر نەبەین و نەهی لە بەڕووتی و بێ جل وبەرگ بە ڕێگادا ڕۆیشتن کردووە.

- بە پلەی یەکەم جل و بەرگ پۆشین بۆ داپۆشینی ئەندامەکانی لەش بەکاردێت.

- بە پلەی دووەمیش جل و بەرگ پۆشین بۆ بەرگری لەش لە سەرما و گەرمای هەتاو و گیان لەبەران بەکاردێت.

کەواتە فێردەبین کە جل و بەرگ بۆ خۆدەرخستن و خۆ بەناوبانگ کردن بەکارنایەت لە راستیدا.

- پیاوی موسوڵمان نابێت جل و بەرگی ئاوریشم لەبەربکات هەروەها ملوانکەی زێر و ئەنگوستیلەی زێر و هەرشتێکی دیکەی زێر، بۆ پیاوان حەرامە، بە پێچەوانەوە جل و بەرگی ئاوریشم و زێر بۆ ژنان دروستە ( حەلاڵە ).

- هەروەها نابێت پیاوان جل و بەرگی ژنان بپۆشن، ژنانیش نابێت جل و بەرگی پیاوان بپۆشن.

- ئیسلام فێرمان دەکات کە جل و بەرگی سپی زۆر باشە و ڕەنگێکی جوانە.

## خواردن

- لەسەر هەر مرۆڤێك پێویستە کە خواردن بخوات بۆ ئەوەی بـژیت، نەوەك بژیت بۆئەوەی خواردن بخوات.

- هەرکەسێك لـە خـواردن مـام ناوەنـد بـێت و زۆر نـەخوات ئـەوا لەشـێکی تەندروسـت و سـاغی دەبـێت. خـواردنی زیـاد لـە پێویـست تەندروستی مرۆڤ تێك دەدات جوانی و شێوەی دەم و چاو ( ڕوخسار ) تێك دەدات.

شێوازی نان خواردن و ئاداب و یاساکانی بەم جۆرەیە:

١- دەست و رووخسار شوشتن.

٢- وتنی (( بسم الله الرحمن الرحيم )) واتە: بە ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان، لەپێش نان خواردن.

٣- گەر دووکەس بوون و لەیەك قاپ نانتان دەخوارد ئەوا پێویستە لە بەشی پێشەوەی خۆت خواردن بخۆیت.

٤- بە هێمنی و ئاسایی نان خواردن بخۆین.

٥- لەکاتی نان خواردن سەیری کەسانی دیکە نەکـەین کـە لـە چـوار دەورمانن.

٦- لەکاتی نان خواردن زۆر قسە نەکەین.

٧- لە دوای نان خواردن شوکر و سوپاسی خـودای گـەورە بکـەین بـە وتنی ( الحمدلله رب العالمين )واتە: سوپاس بۆ خودای جیهانیان.

**شتێکی گرنگ هەیە کە پێویستە گوێڕایەڵ بین ئەویش ئەوەیە لەکاتی خواردن بەڕێگادا نەڕۆین، جگە لەکاتی زۆر پێویست.**

## چەند شتێکی زۆر بە سوود لە ڕوانگەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام:

١- خواردنی نانی جۆ، کە نان و خواردنی پێغەمبەران بووە.

٢- برنجی شل ( برنج بە شیر ).

٣- برنج.

٤- شیری مانگا، کە دەرمانە و چەوریەکەشی زۆر بە سوودە.

٥- زەیتوون و سرکە و کودوو ( کولەکە ) و ڕەشکە و خورماو هەنگوین.

٦- خواردنی زەیتوون خڵتەی قوڕگ ناهێڵێت و مێشك بەهێز دەکات.

٧- خواردنی کدوو ( کوولەکە ) دەبێتە هۆی بەهێز بوونی دڵ.

٨- خواردنی فاسۆلیاو خورما دەبێت هۆی بە هێزبوون و چالاك بوونی دڵ و ماسولکەکانی لەش.

## زیادەڕۆی کردن ( ئیسراف کردن )

- بە بەکارهێنانی شتێك زیاتر و گەورەتر لە قەبارەو ڕێژەکەی دەڵێن ئیسراف کردن.

خودای گەورە کەسانی ئیسراف کەری خۆش ناوێت، هەروەها فەرمان دەکات کە ئەوکەسەی ئیسراف دەکات ئەوا ئەوانە برای شەیطان و خراپەکارانن.

- لەسەر مرۆڤی موسوڵمان پێویستە لەو شتانە ئیسراف نەکات:

١- خواردن (نان، میوە، سەوزە و. . . )

٢- خواردنەوە ( ئاو، شەربەت و. .. )

٣- جل و بەرگ کڕین.

٤- شتومەکی ناو ماڵ کڕین.

٥- پارە خەرج کردن.

٦- ئۆتۆمبێل و خانووی زۆر گەورە کڕین...هتد.

## سەیرکردن

- سەیرکرن بە ڕواڵەت کردارێك و شتێکی سادە و ئاساییە، بەلاّم لە ڕوانگەی ناوەڕۆك و بابەتێکی گرنگ و پڕ واتایە.

- لە ئیسلام دا دەبێت هەر سەیرکردنێك لە ژیان لەبەر ویست و ڕەزامەندی خودای گەورە بێت و چاومان بپارێزین لە خراپە و حەڕام.

- مرۆڤی موسوڵمان و ئیماندار نابێت سەیری ئافرەتی بێگانەبکات.

- مرۆڤی موسوڵمان و ئیماندار نابێت سەیری دەرگاو ماڵی خەڵك بکات.

- مرۆڤی موسوڵمان و ئیماندار نابێت سەیری خێزانی خەڵك و بێگانە بکات لە ناو ئۆتۆمبێلێ یان گەشت کردن

- سەیرکردنی دایك و باوك لە ڕووی چاکەو خۆشەویستی عیبادەتە.

- سەیرکردن و خۆش ویستنی قورئان عیبادەتە.



## ئاوی دەم ڕۆکردن و ئاوی لووت ڕۆکردن

- هەر شتێك لە ژیانی مرۆڤ گرنگی هەبێت، لە دنیـای ئیـسلامیش گرنگە و بەرنامەی بۆ دارێژراوە.

- لە بابەتی ئاوی دەم ڕۆکردن، ئەگەر لە گەل خڵتەی سینگ بوو یان بە تەنیا (تف) بوو ئەوا لەسەر مرۆڤی موسوڵمان و ئیمانداره کە دوور لـە چاوی خەڵك و لە بـن دارو ڕووبـار و چـوار دەوری مزگـەوت ئـەو خڵتـەی سینگ و تفە ( ناودەم ) ڕۆبکات و فڕێ ی بدات.

- لە بابەتی ئەو شـت و ئـاوەی کـە لـە لـووتی مـرۆڤ دایـە، ئـەوا پێویستە ئەو کەسە شوێنێکی چۆڵ بدۆزێتەوە ئینجا ئاوی لووتی بە پارچـە پەڕۆی تایبەت یان کلێنکس پاك بکاتەوە.

## چوونە سەر ئاو

- لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە بەشی ئادابی ژیان فێرمان دەکات کـە لەسەر مرۆڤی موسوڵمان و ئیمانـدار پێویـستە ئەگـەر کـاری سـەر ئـاوی هەبوو ئەوا دەبێت بچێتە شوێنێك کـە دوور بـێت لەبـەر چـاوی خـەڵك و نادیار بێت، هەروەها پێویستە دواتر دەستی بە صابوون و ئاو بشوات.

- لەکاتی چوونە سەر ئاو لە پێشدا پێویستە بڵێین ( بسم الله، اللـهم إني أعوذ بك من الخبث و الخبائث )

واتە: بەناوی تۆ خودایە پەنادەگرم بە تۆ لە شەڕی خراپە و شەیطان.

دواتر بۆ چونە ناو ئاودەست دەبێت بە قاچی چەپ بچین و بە قاچی راست بێینە دەرو لەکاتی هاتنە دەرەوەش بڵێین و ئەم دوعایەخوێنین ( الحمدالله الذي اذهب عني الاذى و عافاني).

واتە: خوایەگیان سوپاس بۆ تۆ کە ئەزیەت و ئازارت لێ دوور خستمەوە.

*سەرچاوە: پەرتووکی ( بەهەشتی ژیان )، د.جواد مصطفوی.*

## فەرموودە پیرۆزەکانی پێغەمبەر

١- سَأَلَ رَجُلٌ رَسُوْلَ اللهِ (ﷺ) أيُّ الاسْلامِ خَيْرٌ؟ قَالَ: تُطْعِمُ الطَعامَ وَ تَقْرأُ السَّلامَ عَلى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ. (متفق عليه) واتە : پیاوێك لە پێغەمبەری خودای (دروودی خوای لەسەر بێت) پرسی: چ جۆرە موسوڵمانێك چاکترە؟ فەرمووی: خۆراك ببەخشیت و سلاو بکەیت لەوەی ئەیناسیت و لەوەش کە نایناسیت.

٢- قَالَ رَسُوْلَ اللهِ(ﷺ): أَرْبَعٌ إِذَا كُنَّ فِيكَ فَلَا عَلَيْكَ مَا فَاتَكَ مِنَ الدُّنْيا صِدْقُ حَدِيثٍ وَ حِفظُ أَمَانَةٍ وَحُسْنُ الخُلُقِ وَعِفَّةٌ مَطعَمٍ. صحيح رواه احمد و الحاكم.

واتە : ئەگەر چوار سیفەتت تێدا هەبوو، ئەوا گوێ مەدە بەوەی لە دەستت چووە لە دنیادا، راستگۆیی، پاراستنی سپاردە (أمانە)، رەووشتی جوان، پاکی و حەلاڵی خۆراك.

٣- قالَ رَسوُلَ اللهِ (ﷺ): إذَا أحْبَبتُمْ أنْ يُحِبَكُمُ اللّهُ تعالى وَرَسُلَهُ فَأدُّوا إذَا ائتُمِنتُم وَصَدِقُوا اَذَا حَدَثتُمْ، وَأحسِنُوا جِوارَ مَنْ جَاوَرَكُمْ. (متفق عليه)

واتـه / ئەگـەر دەتانەوێـت خـوا و پـێغمبەر ئـێوەی خـۆش بوێـت ئـەوا راسپاردەکان بدەنەوە خاوەنەکانیان، راسـتـگۆبن کە قسەدەکەن چاکیش بن لەگەل ئەو کەسەی دەبێتەدراوسێتان.

٤- قالَ رَسوُلَ اللهِ (ﷺ): إجْتَنِبوا الْخمْرَفإنّهَا مِفْتَاحُ كُلِّ شَرّ. رواه الحاكم و البيهقي بسند صحيح.

واتـه : دوور کەونـەوە لـه مـەی خواردنـەوە چـونکە کلیلـی هـەموو ئاژاوەیەکە .

٥- قالَ رَسوُلَ اللهِ (ﷺ): مَنْ كَانَ يؤمِنُ بِااللهِ وَلْيَوْمِ الآخِرِ فَلَا يَقْعُدْ عَلَى مَائِدَةٍ يُشْرَبُ عَلَيْهَا الْخَمْرُ. حديث صحيح رواه الطبراني.

واته : هـەر کەسێك باوەری بە خـودا و رۆژی دوایی هەیە با لەسـەر مێزی مەی خواردنەوە دانەنیشێ.

٦- عن ابي ذر الغفاري (ﷺ) قالَ: أوصَاني خَلِلي رَسُلَ اللهِ (ﷺ) بِخِصالٍ مِنَ الْخَيْرِ وَأوْصاني أنْ لاأنْظُرَ مَنْ هُوَ فَوْقي، وَأنَّ أنْظُرَ إلى مَنْ هُوَ دُوني، وَأوصَانِي بِحُبِ الْمَسَاكِنَ وَالْدُنو مِنهُمْ وَأوصَاني أنْ أصِلَ رَحْمي وَأنْ ادبرت وَاوُصَاني أنْ أخافُ في اللهِ لومةَ لائمْ وَأوصَاني أنْ أكْثِرَ من القول (لاحَوْلَ وَلا قوَّةِ ألا بااللهِ) فإنَّهَا كَنْزٌ مِنْ كنوز الْجَنَّةِ. حَدِيث صَحِحْ رواه الطبراني وَابن الحبان.

واتــه : ئــەبو زەری غــەفاری (رەزا و رەحــمـەتی خــودای لەســەر بێت) دەفەرموێت خۆشەویستم حەزرەتی پێغەمبەر (ﷺ) مۆژگاری کردوم بە شەش شت کە چاك:

ئامۆژگاری کردووم کـە تەماشـای لـە خـۆم دەوڵەمەنـدتر نەکـەم، هـەر تەمەشای لەخۆم نزم تر بکـەم.

ئامۆژگاری کردووم کە هەژارانم خۆش بوێت.
ئامۆژگاری کردووم کە سیلەی ڕەحم (واتە: سەردانی خزمان و دۆستان) بە جێ بهێنم.
ئامۆژگاری کردووم لە پێناو خوادا لەکەس نەترسم.
ئامۆژگاری کردووم کە هەر قسەی حەق بڵێم با تاڵیش بێ و زەرەری منیشی هەبێ.
ئامۆژگاری کردووم کە زۆر زیکری ( لاحول ولا قوت الا باالله) بکەم چونکە گەنجینەیەکە لە گەنجینەکانی بەهەشت.

٧- قالَ رَسُولَ اللهِ(ﷺ): نهيتُ أنْ أمْشِي عُرياناً. حديث حسن رواه الطبراني.

واتە: لێم قەدەغەکراوە بەرووتی بە ڕێگادا بڕۆم.

٨- عن ابي السعيد الخدري (رضي الله عنه) أنَّ ٱلنبي ﷺ نهى عنْ ٱلشُّرب قائماً. رواه الطبراني بإسناد حسن.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کردووە لە خواردنەوەی ئاو بە پێوە.

٩- قالَ رَسُولَ اللهِ(ﷺ): مَلعُن من ضارَّ مُسلماً أو مَكَرَ بهِ. رواه الترمذي.

واتە: هەرکەسێ زیان بە موسوڵمانێك بگەیەنێت یان فێڵی لێ بکات، ئەوە نەفرینی لێ کراوە.

١٠-قالَ رَسُولَ اللهِ(ﷺ): ثلاثٌ حَقٌ عَلَى الْمُسْلِمِ، ٱلْغُسْلُ يَوْمَ الْجُمُعَةِوَالسّواكَ وَالطِّيبُ. صحيح الجامع الصغير.

واتە: سێ شت پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێك خۆشوشتن لەڕۆژی هەینی، سیواك کردن، خۆبۆنخۆش کردن.

١١-قالَ رَسُولَ اللهِ(ﷺ): مَنْ صَلَّى عَلَى ٱلنَبي ﷺ وَاحِدَةً صَلَّى اللهُ عَلَيْهَا وَمَلائِكَتُهُ سَبْعِينَ مَرّةً. رواه أحمد عن عبدالله بن عمر بن قيس.

واتە : هەرکەسێك یەك سەلاوات لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) بدات خوای گەورە و فریشتەکان حەفتا سەلاواتی لەسەر لێ دەدەن.

١٢-قَالَ رَسُوْلَ اللهِ(ﷺ): مَنْ صَلَّى عَلَيَّ مِنْ أُمَّتِي عَلَيَّ مُخْلِصاً مِنْ قَلْبِهِ، صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْرَ صَلَوَاتٍ، وَرَفَعَهُ بِهَا عَشْرَ دَرَجَاتٍ، وَكَتَبَ لَهُ بِهَا عَشْرَ حَسَنَاتٍ، وَعَفَا عَنْهُ عَشْرَ سَيِّئَاتٍ.

واتە : هەر کەسێك لە دڵەوە بە دڵسۆزی سەلاوات لەسەر من لێبدات، خوای گەورە (دە) سەلاواتی لەسەر لێدەدات، (دە) پلە بەرزی دەکاتەوە و (دە) چاکەی بۆ دەنووسێ وە لە (دە) گوناهیشی خۆش دەبێ ( رەش دەکاتەوە ) . (متفق علیه)

١٣-قَالَ رَسُوْلَ اللهِ(ﷺ): مَنْ صَلَّى حِينَ يُصْبِحُ عَشْراً وَ حِيْنَ يُمْسِي عَشْراً، أَدْرَكَتْهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ. رواه الطبراني عن أبي الدرداء رضي الله عنه بإسناد جيد.

واتە : هەریەکێك بەیانیان و ئێواران (دە) سەلاوات لەسەر من لێ بدات، لەرۆژی دواییدا بەر شەفاعەتم دەکەوێت.

١٤-قَالَ رَسُوْلَ اللهِ(ﷺ): مَلْعُوْنٌ مَنْ سَبَّ وَالِدَيهِ. رواه أحمد وأبو يعلي و الطبراني عن ابن عباس، بسند جيد قاله الحافظ العراقي.

واتە : دوورە لە رەحمەتی خودا ئەو کەسەی جنێو بە دایك و باوکی بدات.

١٥-قَالَ رَسُوْلَ اللهِ(ﷺ): اَفْضَلُ الصَّدَقَةِ إصلاحُ ذَاتِ بَيْنٍ. رواه الطبراني و البزار.

واتە : گەورەترین خێر و چاکە بریتییە لە چاك کردنی نێوان خەڵك.

١٦-قَالَ رَسُوْلَ اللهِ(ﷺ): لا يَدْخُلُ الجَنَّةَ نَمَّامٌ. (متفق عليه)

واتە : ئەوکەسەی دووزمانی بکات و نێوانی خەڵکی تێکبدات ناچێتە بەهەشتەوە.

١٧-قالَ رَسُولَ اللهِ(ﷺ): اَلسَّلامُ قَبْلَ الْكَلاَمِ. رواه الترمزي.

واته: سەلام كردن پێش قسەكردنە، كاتێ دەگەن بەیەكتری نابێ قسە بكرێ پێش سەلام كردن، چونكە پێغمبەرﷺ دەفەرمووێ (مَنْ بَدَأَ الكَلامِ قَبْلَ السَّلامِ، فَلاَ تُجِيبُوهُ). هەركەسێك پێش سەلام كردن قسەی لەگەل كردن وەلاٌمی مەدەنەوە.

١٨-قالَ رَسُولَ اللهِ(ﷺ): مَنْ قَرَأَ قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدْ عَشْرَ مَرَّاتٍ بَنَى اللهُ لَهُ قَصْراً فِي الْجَنَّةِ. رواه أحمد بسند حسن.

واته: هەركەسێك (دە) جار( قل هو الله أحد ) بخوێنێ خودا لە بەهەشتدا مالێكی ( كۆشك) یێكی بۆ دروست دەكات.

١٩-قالَ رَسُولَ اللهِ(ﷺ): مَلْعُونٌ مَنْ ضَّارَ مُسلِماً أَوْمَكَرَ بِهِ. رواه الترمذي بسند حسن.

واته: هەركەس زیان بە موسولمانێك بگەیەنێت یان فێلی لێ بكات، ئەوە نەفرینی لێ كراوە.

٢٠-قالَ رَسُولَ اللهِ(ﷺ): مَا يُصِيبُ مِنْ نَصَبٍ وَلاَ وَصَبٍ وَلاَهَمٍّ وَلاَ حَزَنٍ وَلاَأَذيٍ وَلاَ غَمٍ حَتَى الشَّوْكَةُ يُشَاكُهَا إِلاَ كَفَّرَ اللهُ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ. رواه البخاري.

واته: هەر مووسولمانێك تووشی هیلاكی و نەخۆشی و دل تەنگی و غەم و پەژارە بێت، وە دركێكی لە پێدا رابچێت خوای پەروەردگار دەیكاتە سرینەوەی تاوان و گوناهەكانی بەمەرجێك ئارام گرێ ناشكور نەبێت.

٢١-قالَ رَسُولَ اللهِ(ﷺ): لاَيَدْخُلُ الجَنَّةَ قَاطِعٌ. رواه مسلم.

واته: ئەوەی سەر لە خزم و كەسی نادات ناچێتە بەهەشت.

٢٢-قالَ رَسُولَ اللهِ(ﷺ): لسعد بن ابي وقاص (رضي الله عنه) يَاسَعْدْ أَطِبْ مَطْعَمَكْ تَكُنْ مسْتَجَابَ الدَّعْوَةِ. رواه الطبراني

واتە: ئەی سەعد با خواردن و خواردنەوەکەت حەلاڵ و پاك بێت دوعات وەردەگیرێت،

٢٣- قال رَسُولَ اللهِ(ﷺ): وَالَّذي نَفس مُحَمَّدُ بِيَدِهِ لِيَقذِفَ اللقمة الحرام في جَوفه لايتقَبَّلَ اللهُ مِنهُ عَمَلاً أربَعينَ يوماً. رواه الطبراني.

واتە: سوێند بەوەی کەنەفسی موحەمەدی بەدەستە، هەرکەسێك پارووبەکی حەرامی بچێتە ناو دەمی، ئەوا هەتا (٤٠) رۆژ خودای گەورە کردەوەی لی وەرناگری.

٢٤-قالَ رَسُولَ اللهِ(ﷺ): أَلحَيَاءُ وَأَلعَيُّ شُعبَتَانِ مِنَ ألأيمَانِ، وَالْبَذاء وَالْبَيَانُ شُعبَتَانِ مِنَ أَلنِّفَاقِ. رواه أحمد.

واتە: شەرم و زمان پاکی دوو لقن لە باوەر، سوکی و قسە زلیش دوو لقن لە دوو روویی.

٢٥-قالَ رَسُولَ اللهِ(ﷺ): إنّي لاَ أُصافِحُ النِّسـاءَ. ... رواه الترمزي بسند صحيح.

واتە: من تەوقە لەگەل ئافرەتان ناکەم.

٢٦-ثابتی کوری ضحاك ﷺ گێراوبەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ( من قتل نفسه بشيء عذبه الله بما قتل بة نفسهُ يوم القيامة(متفق عليه)

واتە: هەر یەکێك خۆی بەشتێك بکوژێت خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا سزای دەدات بەو شتەی کە خۆی پێکوشتووە. لە ریوایەتێکی تردا دەفەرمووێت ( من قتل نفسه بحديدةٍ فحيددته في يده يجأ بها في بطنه في نار جهنم خالداً مخلداً فيها أبداً ومن تردّى من جبل فقتل نفسه فهو يتردي في نار جهنم خالداً مخلداً فيها أبداً. (متفق عليه)

واتە: هەرکەسێك خۆی بکوژێت بە ئاسنێك هەمان ئاسنی لەدەست دا دەبێت لەدەستدا دەبێت لە ئاگری دۆزەخ دا و سکی خۆی پێدەدرێت

بەردەوام. وە هەر کەسێك خۆی لەچیایەکەوە بەربداتەو ... وژێت
لە ئاگری دوزەخ دا لە چیایەکەوە بەردەدرێتەوە خوارەوە ... رامی.

٢٧-ئەبو دەردا ﷺ دەفەرموێت کە پێغەمبەری خودا دەفەرمووێت ﷺ
( لایدخل الجنة عاق ولا مكذوب بقدر ولا مدمن خمر). (متفق عليه)

واتە: ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی کە ئازاری دایك و باوك دەدات وە هەروەها ئەو کەسەی قەدەر بە درۆ دەکاتەوە وە کەسێکیش ئارەق خۆرێکی بەردەوام بێت.

**١–قال رسول الله (صلى الله عليهِ وسلم) : (صَلاةُ الجَماعَةِ اَفْضَلُ مِنْ صَلاةِ الفَذِّ بِسبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجة) رواه المسلم والبخاري**

**واتە: پێغەمبەر محەمەد درود و سەلامی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت: نوێژێك بەکۆمەڵ بکرێت باشترە و خێری زیاترە لەنوێژێك کەبەتەنها بکرێت بەبیست وحەوت پلە.**

**٢– قال رسول الله (صلى الله عليهِ وسلم) : (اَنْ يَستَأجِرَ اَجيراً قَبلَ اَن يَعلَمَهُ اَجرَةُ)**

**رواه احمد**



**واتە: پێغەمبەر محەمەد درود و سەلامی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (قەدەغەی کردووە یەکێك بەکرێبگرێت و نەزانیت کرێیەکەی چەندە)**

**٣– قال رسول الله (صلى الله عليهِ وسلم) (أفضَلُ الصَّدَقَةِ إِصلاَحُ زَاتِ بَين)**

رواه الحـ

واتــه: پێغه ـەر محەمـەد ـ و سـەلامی خـوای لەسـەر بێـت دەفەرموێت:گەورەترین خێر و چاکە بریتیە لە ئاشـت کردنـەوەو چـاك کردنی نێوان خەلك.

٤- قال رسول الله (صلى الله عليهِ وسلم) (إنَّ اللهَ تَعَالَي عَفوٌ يُجِبُّ الْعَفْوَ) رواه الحاكم

واتــه: پێغەمبـەر محەمـەد درود و سـەلامی خـوای لەسـەر بێـت دەفەرموێت:بەڕاستی خودای گەورە و پەروەردگار لێ بوردەیە وەلـێ بووردەشی خۆش دەوێ.

٥- قـال رسـول الله (صـلى الله عليـهِ وسـلم) (قَـالَ رَبّنَـا عزوجـل: (الصِّيامُ جُنَّةٌ يَستَجِيرُ بِهَا العبَدُ مِنَّ النَّـارِ وَهُـوَ لِـي وَأَنـا أجـرِي بِـهِ) رواه احمد البيهقي

واتــه: پێغەمبـەر محەمـەد درود و سـەلامی خـوای لەسـەر بێـت دەفەرموێت: ڕۆژوو قەلغانێکە بەندە لەئاگر دەپارێزێ، ڕۆژوو بۆ منـە، هەرخۆشم پاداشتی دەدەمەوە.

سەرچاوە:

١- پـەرتووکی هـەزار گـوڵ لـە باخـچەی فـەرموودەدا، حەوێـز حـاجی عەلی.
٢- پەرتووکی چل گوڵ.
٣- پەرتووکی دۆزەخ، محمد ملا فائق شارەزووری.

# نوێژ فێربوون

## دەست نوێژ شوشتن

سەرەتا بە دڵ نیەت بێنە و بڵێ:

(( نیازمە بێ دەست نوێژی لەسەر خۆم لادەبەم ))

ئینجا بە زمان ( بِسْمِ الله ) بکە

**هەردوو دەستەکانت بە جوانی بشۆ**





دەمت پاكژ بكەوە، سێ جار ئاوی تێ وەردە.



لوتت پاكژ بكەوە، سێ جار ئاوی تێوەردە.





## رووخسارت جوان بشۆ

لەسەرەتای نیوچەوانتەوە تـا ژێـر چـەناگەو لـە نەرمـەی گوێـوە بـۆ نەرمەی گوێ.



## هەردوو دەستەکانت تا ئەنیشکان بشۆ

ڕاستە پێش چەپە (سێ جار)





## سەرت مەسح كە يەك جار



## هەردوو گوێت مەسح كە جارێك





هەردوو پێیەکانت تا گۆزینگان بشۆ

راستە پێش چەپە ( سێ جار )





**ئینجا دوای تەواو بوونی دەست نوێژ سوننەتە بڵێی:**

(( أَشْـهَدُ أَنْ لا إلَـهَ إلاّ الله وَحْـدَهُ لاَشَـرِيكَ لَـهُ وَأشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، أللَّهُـمَ أجْعَلْـني مِـنَ التَّـوابِينَ وَجْعَلْـني مِـنَ المُتَطَهِّرِينَ))

# نوێژ فێربوون

## به دڵ نیەت بێنه و بڵێ

(( نیتمه دوو رکات نوێژی بەیانی دەکەم ))

ئینجا به زمان

(( أللهُ أَكْبَرْ ))

بکه

دەســـــتەکانت تـــا

نەرمـــــەی گوێـــــیەکانت

بەرزکەوه.





ئینجا دەستی راستت لەسەر دەستی چەپت دانێ لە ژێر سینگت



سورەتی فاتیحە و سورەتێکی تر بخوێنە.

سورەتی فاتیحە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ (١) الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٢) الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ (٣) مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ (٤) إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ (٥) اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ (٦) صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ (٧) آمين. ((الفاتحة: ١ - ٧))



واتە خۆم پەنا دەگرم بە خودا لە شەیتانی بە نەفرەتکراو.

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان (١) هەموو سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان (٢) بەخشندەی میهرەبان (٣) خاوەن رۆژی سزا و پاداشت دانەوە (٤) خوایە تەنها تۆ دەپەرستین، تەنها لە تۆ داوای

یارمەتی دەکەین (٦) ڕێنمونیمان بکە بۆ ڕێگای ڕاست (٥) ڕێگای ئەوانی کە چاکەت لەگەڵ کردوون نەك (ڕێی ) ئەوانەی خەشمی تۆیان لـێ گـیراوە، وەنەك ( ڕێی ) گومرایان (٧). خوایە دوعامان قەبول بکە(آمین)

سورەی الاخلاص

**بسم الله الرحمن الرحيم:**

**(قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ اللَّهُ الصَّمَدُ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ).**

واتە: بڵێ ئەوە، خوای تاك و تەنیایە (١) ئەو خوایەی بێ نیاز و جێی نیاز و ئومێدە (٢) کەسی لێ نەبووە و لەکەس نەبووە (٣) هــەرگیز هــیچ کەس هاوشێوە و هاوتای نییە (٤).





ئینجا

(( ألله أكبر )) بكەو برۆ بۆ ركوع و بلێ:

(( سُبْحانَ رَبِّي الْعَظيمْ وَبِحَمْدِهِ ))

سێ جار

واتە: پاك و بێ گەردی و گەورەیی بۆ پەروەردگاری مەزنمە.

سوپاس و ستایش لایەقی تۆیە.







ئینجا: هەڵسان و دەڵێین:

(سَمِعَ أللهُ لِمَنْ حَمِدَ رَبَّنا وَلَكَ أَلْحَمد)

یەك جار

واتە: خودا ستایشی ئەوکەسەی بیست کە ستایشی کردو سوپاس و پێ زانینی بۆ دەربڕیوە، پەروەردگارمان ستایش بۆ تۆیە.





ئینجا:

((أللە أكْبَرْ )) بكە و برۆ بۆ سوجدە و بڵێ

(( سُبْحانَ رَبِّيَ ألأعْلَى وَبِحَمْدِهِ ))

سێ جار

واتە پاکی و بێ گەردی و گەورەیی بۆ پەروەردگاری زۆر بەرزم، سوپاس و ستایش لایەقی تۆیە.

ئینجا:



بڵێ ((أَللّهُ أَكْبَرْ)) و

دانیشه و دەكرێت ئەم دوعایه بكەی

أَللّٰهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وَارْزُقْنِي

واته: خوایه لێم خۆش ببه و رەحمم پێ بكه و رۆزیم بده.







ئینجا:

((ألله أكْبَرْ )) بكه و جارێكی تر بچۆره سوجده هەمان كرداری سوجدەی پێشوو دووباره بكەرەوه

ئینجا له ( كرنوش ) هەڵسەوه سەر پێ بەمەش یەكەم تەواو دەكەیت و هەڵدەستیتەوه بۆ ئەنجام دانی ركاتی دووەم. ئینجا (( تحیات ))ی درێژ بخوێنه.

التحيات لله والصلوات والطيبات
السلام عليك ايها النبي ورحمة الله
وبركاته السلام علينا وعلى عباد
الله الصالحين أشهد أن لا إله إلا الله
وأشهد أن محمدا عبده ورسوله
اللهم صل على محمد وعلى آل
محمد كما صليت على ابراهيم
وعلى آل إبراهيم إنك حميد مجيد
اللهم بارك على محمد وعلى آل
محمد كما باركت على ابراهيم
وعلى آل إبراهيم إنك حميد مجيد

واته: ( مولك و مانەوە و گەورەیی ) و ( درودو پارانەوە و لالآنـەوە)





و ووشەی پاك و چاك هەر بۆ خودایە، سلاّو رەحمـەت و بەرەكـەتی خـوات لەسەر بێ ئەی پـێغەمبەری خـودا محمـد(ﷺ) سـلاّو لەسـەر ئـێمەش و پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە (ألله) شـایەتی دەدەم كـە محمـد بەنـدە و

نێردراوی خودایە، خوایە درودو ڕەحمەت بڕێژە بەســەر محمــد و خانــەوادە و کەس و کاری محمــد (ﷺ) هــەروەك درودت ڕژانــدووە بەســەر إبــراهیم و کەس و کاری إبراهیم دا ، خوایە فەر و پیرۆزی بڕێژە بەسەر محمــد (ﷺ) و کەسو کاری محمد (ﷺ) دا، هەروەك فــەرو پیرۆزیــت ڕژانــدووە بەســەر إبراهیم و کەس و کاری إبراهیم دا بەراستی تۆ سوپاس کراوو خاوەنی شکۆ و بەزەرییت.

بۆ تەحیاتی کورتیش تا ( أللّهُمَ صَلّى عَلَى مُحَمّدٍ ) دەخوێنی

سوننەتە: لەکاتی شەهادەت هێنان پەنجەی شـایەدی دەسـتی راسـتت بەرزبکەیتەوە تا کۆتایی ( تەحیات )

ئینجا:

بەلای راست سەلام بدەرە و بڵێ:





ألـسَّلامُ عَـلَـيْـكُمْ وَرَحْـمَـةُ أللّه وَبَـرَكـاتُـهُ



بەلای چەپیش سەلام بدەوە و بڵێ:

ألـسَّلامُ عَلَـيْكُمْ وَرَحْمَـةُ أللّه وَبَـرَكـاتُـهُ



## ئەو شتانەی دوست نوێژ هەڵئەوەشێننەوە واتە ئەبن بە هۆی بێ دەست نوێژی:

١- شتێك بێتە دەرەوە لە یەكێك لەو دوو كونانەی خوارەوە كەم بێ یان زۆربێ وشك بێ یان تەڕبێ یان وشك.

٢- نوستن

٣- بێ هۆش بوونە بە هۆی نەخۆشی یان سەرخۆشی.

٤- گەیشتنی پێستی پیاوە بە پێستی ئافرەتی بێگانە كە بەبێ پەردەبێت، واتە پێستی هەردووكیان رووت بێ، ئەو ئافرەتەی مارەیی لە پیاوەكەبێ ئێستا بێت یان لەمەو دوا وەك خوشكە ژن.

٥- بەركەوتنی بەری دەستی مرۆڤ بە ئەندامی زاوزێ (هی خۆی بێت یان هەر كەسێكی تر بچوك بێ یان گەورە).

٦- بەركەوتنی دەستی مرۆڤ بە شوێنی دەرچوونی پاشەرۆ هی خۆی بێت یان هەركەسێكی تر جا بچوك بێ یان گەورە



## ئەو شتانەی نوێژ بەتاڵ ئەکەن

١- قسەکردنی بە قەستی یە هەرچەن تەنها دوو پیتیش بێ وە بلێ ( نا، یا نە. ..هتد )

٢- جموجۆلی زۆر وەك سێ شەقاو لە دوو یەك.

٣- بێ دەست نوێژ بوون.

٤- پەیدابوونی پیسیە لە جلەکانی یان لە ئەندامەکانی.

٥- دەرکەوتنی عەورەتە جا ئەگەر زوو داپۆشێتەوە ئەوە نوێژی بە تاڵ نابێت ئەگەرنا بە تاڵ دەبێت تەنها کاتی کە هیچ شتێك نەبێت عەورەتی پێ داپۆشێت لەو کاتەدا دروستە نوێژی خۆیان بکەن و دوو بارەشی( گێرانەوە)ی ناوێت بیکەنەوە.



٦- گۆرینی نیەتی ئەم نوێژەیە بۆ نوێژێکی تر.

٧- روو لادانە لە ئاستی قیبلە ئەگەر کەم بوو زوو گەرایەوە رووی کردەوە قیبلە نوێژەکەی بەتاڵ نابێت.

٨- خواردنە بە قەستی ئەگەرچی کەمیش بێت.

٩- خواردنەوەیە بە قەستی با کەمیش بێت وەکو تاوانەوەی شتێکی شیرین لە ناو دەم ئینجا بیخوات.

١٠- پێکەنین بە دەنگ.

١١- کافربوون.

١٢- نەکردنی روکنەك یان واجبەك وە فەرزەك لە روکن و فەرزەکانی نوێژ.

## کورت کردنەوە و کۆکردنەوەی نوێژ

## ( صلاة قصر و جمع )

کورت کردنەوەی نوێژ بریتیە لە وەی کە هەر نوێژێك چوار رکات بوو کورت ئەکرێتەوە بۆ دوو رکات.

کۆکردنەوەی نوێژیش بریتیە لە لەجێ هێنانی دوو فەرزی نوێژ لەکاتێکدا.

**نمونە: نوێژی نیوەڕۆ لەگەل نوێژی عەسر.**

کورتکردنەوەی نوێژ و کۆکردنەوەی لە کاتێك بەجێ دەهێنرێ کە کەسێك لەسەفەردابێ.

- نوێژی بەیانی کورت و کۆ ناکرێتەوە.
- نوێژی مەغریب کورت ناکرێتەوە بەلاَم کۆ دەکرێتەوە.



## مەرجەکانی دەست نوێژ

١- پاك و خاوێنی.

کە بریتیە لە پاك و خاوێنی لەش و جل و بەرگ و شوێنی نوێژ کردنەکە.

٢- داپۆشینی عەورەت:

دەبێت پیاو لە ئەژنۆ (چۆك )هەتا ناوكی داپۆشراوبێت، بۆ ئافرەتانیش پێویستە هەموو لەشی داپۆشراوبێت، جگە لە دەم و چاوی لەگەل هەردوو لەپی دەستی.

٣- كاتی هاتنی نوێژ:

پێویستە كەسی نوێژكەر باوەر و زانیاری تەواوی هەبێت كە بەڵێ كاتی نوێژ هاتووە، نوێژكردن لەكاتی پێش بانگران بەتالە و دروست نی یە.

## تەیەممومم

تەیەمموم: بریتیە لە ئاسانكردن یان هەربەجێ هێنانی بنەمای دووەمی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، كە بریتیە لە نوێژ.

تەیەمووم بریتیە لە بەكارهێنانی تۆزی گلێكی پاك لە بری ئاو بۆ دەست نوێژگرتن، بەم شێوەیە كە مرۆڤ دەست بدات بە تۆزێكی پاك و بیدات بەدەم و چاوی و هەردوو قۆلی هەتا ئانیشكی.

## تەیەمووم لەبەر چەند هۆیەك ئەكرێت.

١- نەبوونی ئاو.

٢- لەكاتی نەخۆشی و برین.

٣- ئاو هەیە بەلاّم ترسی ئەوە هەیە كە دوژمن یان هەر هۆیەك كە زیانێك لە ماڵ و منداڵ یان خۆت بدات.

٤- ئاو هەیە بەڵام ترسی گیان لەدەست دانی مرۆڤ هەیە بە هۆی کەمی ئاوەکە.

٥- ئاوێکی زۆر گەرم یان ئاوێکی زۆر سارد.

## تەیەمموم بەوشتانە بەتاڵ دەبێتەوە.

١- بەهەرشتێك کە دەست نوێژی پێ بەتاڵ ئەبێتەوە، تەیەمومیشی پێ بەتاڵ ئەبێتەوە.

٢- کاتێك لەناکاو ئاو دەست ئەکەوێت سەرقالی تەیەمومین.

٣- لاچوونی ساردی ئاو یان گەرمی ئاو یان چاك بوونەوەی برین.



## کۆتـایی و سوپاس نامە

لەگەڵ سوپاس و ڕێزی تایبەت بۆ ستافی چاپخانەی شەهاب، هەروەها هاورێی زۆر خۆشەویست و بەڕێزم کاك (محمد مەلا محسن عبداللە) و (مامۆستا مەلا صابر حسین رسول) کە زۆر یارمەتیدەر و هاورێ بوون لە بەکۆتایی گەیاندنی ئەم بەرهەمە، هیوادارم خودای گەورە ئەجر و پاداشتی نەبراوەیان پێببەخشێت و بۆیان ببێتەی خێر و بەرەکەت و توێشوو دونیاو قیامەت.

وآخِرُ دَعوانا اِن الحمَد للهِ رَبِ العَالمِین



## سەرچاوەکان

١ . پێغەمبەرەکەت محەمەد(ﷺ) بناسە، ژیانی گەورە پیاوانی ئیسلام، لە ئینتەرنێت.

٢ . باوەڕ (عەقیدە)، پەرتوکی (ئیمان) مامۆستا حوسێن قادر پێنجوینی.

٣ . ئادابی ژیان، پەرتوکی (بەهەشتی ژیان) دکتۆر جەواد موصەلەفەوی.

٤ . فەرمودە پیرۆزەکانی پێغەمبەر(ﷺ).

٥ . پەرتوکی (هەزار گوڵ لە باخچەی فەرموودەدا) حەویز حاجی عەلی.

٦ . پەرتوکی (دۆزەخ)، مامۆستا مەلا فائیق شارەزووری.




ئەم نامیلکەیە پێکهاتووە لە:
* پێغەمبەرەکەت بناسە، (ژیاننامەی پێغەمبەر).
* باوەڕ ( عەقیدە)
* ئادابی ژیان.
* فەرموودە.
* نوێژ فێربوون.
چاپخانەی شەهاب
0750 448 3811